# چەند نەگۆڕێك لەسەر ڕێبازی جیهاد دا ؛

- ئەڵقەی سێیەم –

-شیخ یوسف العییري؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

نەگۆڕی سێیەم

## جیهاد پەیوەست بە خاکەوە نییە

دوای ئەوەی لە دوو فەسڵی پێشوودا ئەو بەڵگانەمان خستنە ڕوو کە چەمکی ئەوە دووپات دەکەنەوە جیهاد بۆ هەموو کات وسەردەمێك دەشێتو لەوەتەی خوای پەروەردگار جیهادی بۆ محمدی پەیامبەری خۆی شەرعاندووەو تا قیامەت هیچ سەردەمێك نییە ئاڵای جیهادێکی لە پێناو خوای پەروەردگار تێدا نەبێ، جێگەی خۆیەتی لەم فەسڵەدا ئەو بەڵگانە بخەینە ڕوو کە دووپاتی ئەوە دەکەنەوە جیهاد پەیوەست بە بستە خاکێکی دیاریکراو نییە لە زەویداو، هەر کات هۆکارەکانی بێنە جێ وبەربەستەکانی نەمێنن جیهادەکە هەیەو شەرعییەو دروستە.

یەکێك لەو چەمك وتێگەیشتنە چەوتانەی دەربارەی جیهاد وهۆکاری لادانی مەفهووم وچەمکی ئەو عیبادەتە پەیوەست کردنی جیهادە بە خاکێکی تایبەتەوە، هەر کاتێکیش ئەو خاکە لە دەست چوو یاخود وێران بوو، ئەوا ئەو چەشنە تێگەیشتنە بێگومان مرۆڤ بە

چەپدانی ئەم عیبادەتە یاخود بە ساردبوونەوەی لە جیهاد کردن دەگەینێت، یا ئەوەی مرۆڤ لافی ئەوە لێدا کە جارێ کات وساتی نەهاتووە وهێشتا زووە.

پێویستە پێش ئەوەی لە جیهادیشدا دەستبەکار بین چەمك وتێگەیشتنێکی مەزنی ئەنجامدانی ئەم عیبادەتە لە دڵ ودەروونماندا بچەسپێنن، ئەویش ئەوەیە کە جیهاد چەمکێکی جیهانییەو هیچ مەرز وسنوور وبەربەستێك نییە ڕێی پێ ببڕێتو، موسوڵمانیش هەر کە مەبەستی گەیاندنی دینی خوای پەروەردگار وبانگەشەی خەڵك بوو بۆ بەندایەتی خوای پەروەردگار ئەوە پێویستی بەو عیبادەتە هەیە، هەر وەك چۆن هاوەڵانی پەیامبەر بەو پەیامەوە ڕۆژهەڵات ورۆژئاوای زەمینیان دەپێوا کە ریبعی کوڕی عامیر کاتێك رستم پرسیاری لێدەکا کە چی هێناونەتییە ئێرە دەری دەبڕێت ودەفەرمێ: (خوای پەروەردگار ئێمەی ناردووەو هێناوێنەتییە ئێرە بۆ ئەوەی هەر کەس خۆی بیەوێت لە بەندایەتی بەندەکانەوە بیگۆزینەوە بەندایەتی خوای پەروەردگارو، لە تەنگانەی دونیادا بەرەو فراوانی وڕەحەتی دەریبێنینو، لە ستەم وزوڵمی ئاینەکاندا بیبەینە دادپەروەری ئیسلامەوەو، بەو دینە ڕەوانەی خەڵکی کردووین بانگهێشتیان بکەین، جا هەر کەس لێمان قبووڵکات ئێمەش لێی قبووڵ دەکەینو وازی لێ دێنین وخاکی خۆی بۆ جێدێڵین خۆی بەڕێیوەباتو، هەر کەسیش ئەوەمان لێ ڕەتکاتەوە هەتا هەتا شەڕی لەگەڵدا دەکەین تا بە بەڵێنی پەروەردگارمان دەگەینەوە، وتی: بەڵێنی خوا چییە ؟ فەرمووی: بەهەشتە بۆ ئەوانەی کە لەسەر شەڕی بەرهەڵستان دەمرن وسەرکەوتن وسەرفرازییە بۆ ئەو کەسانەی دەمێننەوە)، بۆیە هاوەڵانی پەیامبەر کە هاتن شمشێر وقورئانیان بە دەستەوە بوو خاكو وڵاتیان پێ ئازاد دەکردو، هەر چەند مرۆڤی موسوڵمان ئەو پەیامە موحەمەدییەی لە شاندا بێ پێویستە ئەو چەمکەش بە خۆیەوە هەڵگرێ کە جیهاد بۆ هەموو کات وسەردەم وبۆ هەموو شوێن ومەکانێك شیاو وگونجاوە.

که دەشڵێین جیهاد بۆ هەموو شوێنێك گونجاوە مانای ئەوە نییە مرۆڤی موسوڵمان جگە لە خۆشکردنی ئاگری شەڕ لە تەواوی زەویدا هیچ کار وپیشەیەکی دی نەبێ، نەخێر؛ بەڵکو هەر شوێنێك مەرجەکانی جیهادی لێ بێنە جێو بەربەستەکانی لاچن جیهادی لێ گونجاوەو، ئەو مەرج وبەربەستانەش کۆمەڵە پێوەرێکی شەرعین گەر بێین وراڤەیانکەین‌و داخڵی وردەکارییەکانیان بین لە باسەکەمان لائەدەین، ولەوانەیە ئەڵقەیەکی تایبەتیان بۆ تەرخانکەین پەڕەکانیان تێدا هەڵدەینەوە.

گرنگ ئەوەی کە قەناعەتمان بەوە بوو جیهاد تا ڕۆژی دوایی بەردەوامەو لە هەموو سەردەمێکدا هەیە - کە بابەتی فەسڵی یەکەم بوو - بێ گومان ئەم قەناعەتە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە جیهاد لە خاکێك وزیاتر لە وڵاتانی جیهانی ئەمڕۆدا بوونی هەیە، ماناکەشی ئەوەیە کە جیهاد پەیوەست نییە بە خاکێکەوە، بەڵکو پەیوەستە بە کۆمەڵە مەرجێك، جا ئەو مەرجانە هۆکاری شەرعی بن یا پێوەری کار وکرداری پراکتیکی، لە هەمان کاتیشدا جیهادەکە بە کۆمەڵە بەربەستێکەوە پەیوەستە، هەر وەختێکیش ئەو مەرجانە بێنە جێو بەربەستەکان لاچن ئەوە جیهادەکە بە ئەنجامێك یاخود کۆمەڵە ئەنجامێکی پۆزەتیڤی جیهاد کردنەوە دەگاتو، هەرگیز ناکرێ بستە خاکێکمان نەبێ بیدۆزینەوە لە جیهاندا هۆکارەکانی جیهاد وپێوەرەکانی لێدا نەیەنە جێ.

ناساندنی ئەم چەمکەش وەك خاڵی دەستپێکی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی ئەم عیبادەتە وا لە بەندەی خوای پەروەردگار دەکات لە ئەنجامدانی ئەو عیبادەتە ئازاد بێت، چونکە بستە خاکێك نییە بیبەستێتەوەو، جیهادی بە وڵاتێکەوە پەیوەست نەکردووە، بەڵکو بە کۆمەڵە مەرج وبەربەستێکییەوە پەیوەست کردووە هەر کاتێك هاتنە جێو بەربەستەکان لاچوون ئیتر شوێن شوێنی گونجاوی ئەنجامدانی ئەو عیبادەتەیە.

کاتێك کە مرۆڤیش چاو بە سیرەت وژیاننامەی پەیامبەردا دەگێڕێتەوە، ئەو چەمکەی پێشووی بۆ ڕوونتر دەبێتەوەو، دەبینێ کە وا موسوڵمانان لە سەرەتای ئیسلامدا خاكو وڵات وماڵیان لەدەست چوو، بەڵام لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئیسلام لەو خاکە پیرۆزەوە نەبێ - کە مەکەیە - لە هیچ جێگەیەکی ترەوە بڵاو نابێتەوە، بە هۆی ئەو پێگەیەی مەکە هەیبوو وەك قیبلەیەکی ئەوکاتی عەرەب وسەنگی وڵاتیان وئەو خاکە بوو کە دەیانناسی وشارەزای خەڵکەکەی بوون، بەڵام پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بە ئەمر وفەرمانی خوای پەروەردگارەوە ئەو خاکەی جێهێلا بۆ ئەوەی لە شوێنێکی ترەوە دەست بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام بکات. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم - وەك کۆچبەر خۆی دەهاتە بەرچاو ومەزەندەی ئەوەی دەکرد ڕوو لە یەمامە یاخود وڵاتی هەجر بکات، پێشتریش سەردانی "طائف"ی کردبوو وبانگەوازەکەی خۆی لەوێ خستبووە ڕوو بەو هیوایەی لەوێوە بانگەوازەکەی بڵاوکاتەوە، بەڵام خوای پەرورەدگار کۆچەکەی ئاڕاستەی "طيبة" کرد وڕووی لە طیبةوە کرد ولەوێوە پایەکانی دەستپێك وجیهاد ومانەوەی داکوتاو، ئاوای کار بۆ خاکی هەندەرانی دەکرد وەك ئەوەی بێشەی لەدایکبوونی خۆی بێتو، ئیسلام لەو بستە خاکەوە بڵاو نەبۆوە کە خۆشەویسترین بستە خاکێك بوو لە لای خوای پەروەردگار وپەیامبەرەکەیدا؛ وەك ئیمامی قُرطُبي لە ابن عباسەوە دەگێڕێتەوە - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - (کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە مەکە دەرچوو، ئاوڕی دایەوەو وفەرمووی: بەڕاستی کە خۆشەویسترین بستە خاکێکی لای خوای پەروەردگار وخۆشەویسترین وڵاتی منی، ئەگەر خەڵکە موشریکەکەشت منیان وەدەرنەنابا قەت دەرنەدەچووم)، لەوێ خوای پەروەردگار ئەو ئایەتە دادەبەزێنێ کە دەفەرموێت: {وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِنْ قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُم فَلَا نَاصِرَ لَهُم} - **زۆر شارو شارۆچکەمان لەناو برد، لەو شارەی کەتۆیان دەرکرد بەهێزتر بوون، هیچ کەسیش نەیتوانی پشتیوانیان بێت** - فەرموودەکەش فەرموودەیەکی دروستەو ئیمامی ثعلبي باسی کردووە.

هەروەها ئیمامی ترمذي وحاكم وابن حبان وكۆمەڵە زانایەكی تر ئەو گوتەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە كە ڕوو لە مەكە دەكات ودەفەرموێ: (چ وڵاتێكی پاك وجوانیت وچەنێك لام خۆشەویستی، گەر خەڵكەكەت منیان لێت وەدەرنەنابا هیچ جێیەكم جگە لە تۆ بۆ خۆم هەڵنەدەبژارد لێی بژیم). لە ریوایەتێكی تردا دەفەرموێت: (قەسەم بە خوا كە تۆ باشترین خاكی خوایت، وخۆشەویسترینیانی لە لای خوای پەروەردگارداو، گەر خەڵكەكەت منیان لێتوە دەرنەكردبا دەرنەدەچووم).

ئاوا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خۆی بە خاكەوە نەبستبۆوە، بەڵكو خۆی بە كۆمەڵە عیبادەتێكەوە پەیوەست كردبوو وهەوڵ وتەلاشی ئەدا بار وشوێنی گونجاویان بۆ فەرهامەكا بیانهێنێتە جێ. ئەوەش پەیڕەو وڕێبازی پەیامبەر بوو صلى الله عليه وسلم هەر لە بانگەواز ولە جیهادەوە بگرەو ولە تەواوی عیبادەتەكانی تردا.

هاوەڵانی پەیامبەریش صلى الله عليه وسلم ئاڵاكەیان لە دوای خۆیدا لەسەر هەمان پەیڕەو وڕێبازی سەرەوەریان هەڵگرتبوو وسەر وخواری زەمینیان كردو، ئەمجارەیان وەك مەكە بە هۆی ستەم وزۆرەوە نەبوو كەماڵئاواییان لە مەدینەی شاری پەیامبەر كرد صلى الله عليه وسلم، بەڵكو پیرۆزترین خاكی دوای مەكەیان بۆ بڵاوكردنەوەی دین وبەجێهێنانی عیبادەتی جیهاد لە ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای زەمیندا جێهێڵا.

ئیمامی مالیك لە كتێبی "موطأ"دا ئەو چەمكە ڕۆشندەكاتەوەو دەفەرموێ: أبو الدرداء ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ نامەیەك ڕەوانەی سەلمانی فارسی دەكات ودەفەرمێ: ڕوو لەو خاكە پیرۆزەوە بكە، سەلمان ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ وەڵامی بۆ دەنووسێت ودەفەرمێ: خاك هیچ كەسێك پیرۆز ناكات، ئەوەی مرۆڤ پیرۆزكات كردارەكانییەتی.

بۆیە قەت جیهادیان بە مەکەو بە مەدینەو هەروەها بە "بیت المقدس"یش پەیوەست نەکردبوو، بەڵکو جیهادیان وەك عیبادەتێك دەهاتە بەرچاو هۆکارەکانی لە هەر کوێدا فەراهەم بن بۆ خوای پەروەردگاری ئەنجام دەدەن وبەجێی دەگەینن.

ئەگەر موسوڵمانانیش جیهادیان بە خاکەوە پەیوەست کردبا ئەوە لەمێژ بوو ئەو عیبادەتە تیاچووبوو، چونکە موسوڵمان چ لە مێژووی کۆن وچ لە مێژووی هاوچەرخیشیاندا شوێنێکی زۆریان لەدەست چووە، بۆیە کە جیهاد بە "بیت المقدس"ەوە دەبەسترێتەوە سەرەنجام کە موسوڵمانان ناتوانن ئازادیکەن یا ئەوەتا دوای ئازادکردنییەوە جیهادەکە نامێنێت وتیادەچێ، چونکە لە هەر دوو حاڵەتدا کە تاکە هۆکاری جیهاد نەما جیهادەکەش نامێنێت‌و، ئەوەش بەڵگەیەکی ڕوونی گومڕایی هەر کەسێکە بڵێت ململانێی ئێمەو جوولەکە لەسەر بستە خاکێکە، نەخێر بەڵکو ئەو کەسە ڕاست ناکات چونکە ململانێی ئێمەو جوولەکە ململانێی بیر وباوەڕەو ئەگەر بێت وموسوڵمانان تەواوی وڵاتی خۆیان لە چنگ دەربێنن ئەوە هێشتا پێویستە لە خاکی خۆشیاندا شوێنیان کەون وهێرشیان بۆ بەرن، هەر وەك چۆن پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وهاوەڵانیشی لە دوای خۆیدا کردیان.

چەمکی بەستنەوەی جیهادیش بە خاکەوە چەمك وحاڵی بوونێکی نابەجێی ئەو عیبادەتەیە کە هەرکات ئەو خاکە لەدەستچوو مرۆڤیش دەستبەرداری ئەو عیبادەتە دەبێت‌و، هەر ئەوەش دەبێتە هۆکاری لادانی عیبادەتی تریش هەر کات بە هۆکارێکەوە پەیوەست کران خوای پەروەردگار دیاری نەکردبێ.

ئەوەیە کە پێویستە لێی حاڵی بین دەربارەی مانەوەی جیهاد وئاڵاکەی لە هەموو سەردەم ورۆژگارێکداو، هەر کەسیش کە جیهاد بە خاکەوە ببەستێتەوە بێگومان لە سەرەنجامیشدا کە ئەو خاکە لە دەست چوو دەڵێ جیهادیش نییە.

